# حاجیلە



دەزگای ڕۆشنبیریی شەفەق - کەرکووک
بۆ تەمەنی ۹ تا ١٤ ساڵ
نیسان ۲۰۱۱
۱۰

گوڵـی حاجیـلەکانی دەشـــتی هامـــوون
نەکەی بیدەی بە نێرگزجاڕی گەردوون
حاجی قادری کۆیی



له چیای سیپانەوه له باکوری کوردستان بەرەو باشووری کوردستان هاتووە بۆ بینینی ئاگرەکەی باوەگوڕگوڕ ئێستە لای ئێمە لەنێو
رووپەرەکانی ئەم گۆوارەماندا میوانە، تۆی ئازیز ئەگەر دۆزیتەوە ئەوا دیارییەکی تایبەت پێشکێش دەکەین.





# بێچووی ئاژەڵان

کاتێ دڵم خۆشە و حەزم بە یارییە، کلک
بادەدەم و دەوەڕم.
دەزانن من کێم؟ دایکی من دەڵەسەگە و
خۆم تووتکە سەگم.
ئێمە زۆر چالاکین و حەزمان لە ڕاکەڕاکەیە و
بە وەفاداری ناسراوین.
هەروەها پاسەوانی باشین بۆ خاوەنەکەمان
و ماڵ و ماڵاتەکەی.

ئا: زەریف



چاپخانەی
ئاراس
هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil

# گوڵزاری حاجیلە





## ئۆرکیدی کەوشین

عەزیز قوشقایە

نیشتمانی ئەم گوڵە پارزەوینی ئاسیایە.
بۆ لێکردنەوەی گوڵەکانی دەروێنرێ.
دەکرێ لە نێو ئینجانەشدا بروێنرێ.



## هێلانەی مەل

خونچە شەریف - شۆڕیجە

نیشتمانی ئەم ڕووەکە وڵاتانی ئاسیا و خۆرهەڵاتی ئەفریقیایە.
لە وەرزی گەشەکردندا حەزی لە گەرمی و خاکی شێدارە. هەروەها لە سێبەر دەروێنرێ.
بڕێکی کەم پەیینی دەوێ و بە زستان ئاودانی کەمی دەوێ و پێویستە شوێنەکەی زۆر سارد نەبێ.

## بیبەری ڕازاندنەوە

حەسەن شەریف-باپیلان



نیشتمانی ئەم ڕووەکە بەتەواوی نەزانراوە. بەڵام لە کۆنەوە هیندییەکانی ئەمەریکا (هیندییە سوورەکان) ئەم ڕووەکەیان چاندووە.
ئەو جۆرەی بە بەربڵاوی دەچێنرێ بە (فریزدۆرفەر) ناسراوە و ڕەنگی بەرەکەی زەرد و پرتەقالی و سوورە.
وەرزی گەشەکردنی ل سەرەتای پایزەوە دەست پێدەکات.

## بەهار

پەرژین سەلام - چەمچەماڵ

دیسان وەرزی بەهارە
وەرزی گەشت و گوزارە
دەشت بەرگی سەوزی پۆشی
ژیان پڕ بوو لە خۆشی
بەفری شاخ توایەوە
دنیا وا بووژایەوە
گوڵاڵەسوورەی ڕەنگین
جوانیی بەخشیوە بە ژین
سەوزەگیای نەرم و جوان
باوەشی ڕاخست بۆمان
ئای لەم دیمەنە جوانە
گشتی کاری خوا گیانە



## منالێکی جوانم

ئەسعەد لوڕزادە- چەمچەماڵ

چەند جوان خۆمم گۆڕیوە!!
بەرگی تازەم پۆشیوە
خەندەم لەڕوو دەبارێ
جوانی دەدەم بە شارێ
نینۆکەکانی پەنجەم
حەز ناکەم درێژیانکەم
لەماڵبم، لە هەر کوێیە
دەسری خۆمم پێیە
هەمیشە هەر خاوێنم
ژینگەی شارم ناشێوێنم
هەتا بڵێی جوانم
بەرخۆڵەی کوردستانم



## مەتەڵ

عوسمان دەروێش - کەرکووک

پێنج پیتە مەتەڵ دڵۆپە ئاوە
لەسەر پەرەی گوڵ یا گیا وەستاوە
وەک فرمێسکێ چاو روون و گەش دیارە
زیاتر لە زستان یان لە بەهارە
پیتی یەک و دوو لەگەڵ پیتی سێ
کە رۆژ ئاوا بوو ئینجا ئەو دادێ
پیتی یەک و دوو و پێنجی بۆ دانە
خۆشەویستەکەی وەلی دێوانە
پیتی پێنج و چوار بنووسیتەوە
تۆی وا مەتەلمان دەخوێنیتەوە

## فەرهەنگی جاجیلە

بێلان - کەرکووک

بالانس balance

هاوسەنگی، کاتێک شتێک بالانس دەکەی واتا هاوسەنگی دەکەی وەک دوو تای تەرازوو کە هەردووکیان بەرامبەر وەستان ئەوە بالانس وەستاون.

بۆڵ ball

تۆپ، تۆپ ئەو شتە خڕەیە کە قەبارەی جۆراوجۆری هەیە و لە چەندین یاریدا بەکار دێ وەک تۆپی پێ و تێنس.

بالوون balloon

دەبدەبە، شیشلدان، میزلدان، شتێکی بچووکی لاستیکە کە فووت تێی کرد گەورە دەبێ و شێوەی جۆراوجۆر وەردەگرێ.

بەنانە banana

مۆز، میوەیەکی شیرینی درێژکۆڵەیە، توێکڵێکی زەردی ئەستووری هەیە.

باند band

تیپی موزیک، بریتییە لە چەند کەسێک بە یەکەوە ئامێری جۆراوجۆری موزیک دەژەنن و ئاوازی خۆش لێ دەدەن.

بەند، بەو شریتەش دەگوترێ کە ناوقەدی شتێکی پێ دەبەسترێ وەک دەسکە گوڵ.

بانک bank

بانک، ئەو شوێنەیە کە پارێزگاری لە پارە و کەلوپەلی گرانبایی خەڵک دەکا. بۆیە خەڵک پارە و زێڕ و ئەو شتانە لەوێ دادەنێن و کە پێویستیان پێیان بوو دەیانبەنەوە.

بە کەناریش دەگوترێ بانک، ئەویش ئەو زەوییەیە لە تەنیشت لێواری ڕووبار و زێ و دەریاچەکانە.

## ناوی کچانەی نوێ

بەناز عومەر-هەولێر

ڤین: ڤیان

ئالیا: گوڵ خونچە

تانان : گوندێکی کوردستانە

چۆڤان: بەڵێن

دیدەڤان: پاسەوان

ڕۆزیا: ناوی گوڵێکە

ژیا: ناوی گوڵە

کەڤال: تابلۆ

گریشی: ناوی شاخە

لۆهان: شایی

لیندە: قەشەنگ

نڤار: ئەفراندن

هێلیان: هێلانە

شاتوو: تووی مەزن

خەیار: ئاروو

## ڕەنگ

سەربەست جەلال - کۆیە

**ئەم ڕەنگانەی لای خوارەوە بکەی بەسەر یەکدا ، یان لێکیان دەرکە ، چ ڕەنگێکمان دەست دەکەوێ !**

١- ڕەش + زەرد=

٢- نارنجی - سوور=

٣- سوور +سپی=

٤- زەرد+سوور=

٥- مۆر-شین=

٦- سپی+ڕەش=

٧- سەوز+سوور=

٨- شین+سوور=

٩- پرتەقاڵی+شین=

١٠- زەرد+شین=

١١- شین + زەرد+سوور=

## پیرەمێرد

ئاشتی عەبدوڵڵا – پردێ



شـــاعیری گەورەی کورد پیرەمێرد، ناوی تەواوی تۆفیق بەگـــی مەحموود ئاغای هەمزە ئاغای مەسرەفە، ساڵی ١٨٦٧ لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لەدایک بووە.
پیرەمێرد لە تەمەنی ٧ ساڵیدا دەچێتە حوجرە بۆ خوێندن و لەوی فێری نووسین و خوێنـــدن و خوێندنەوەی قورئان و زمانـــی عارەبی دەبێ. لە کۆلیجی (ماف) وەردەگیرێ و تەواوی دەکا و تا ساڵی ١٩٠٨ کاری پارێزەری دەکا.
ڕۆژنامەی (ژیان) ســـاڵی ١٩٢٦ دەرچوو، پیرەمێرد بووە سەرپەرشـــتیاری و ساڵی ١٩٣٢ دوای مردنی حوسێن نازم، پیرەمێرد بووە بەرپرس و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە.
دوای ئەوە لە ســـاڵی ١٩٣٧ ڕۆژنامەی (ژین)ی دەرکرد کە تا ١٥ی حوزەیرانی ١٩٥٠ بەردەوام بوو و ١٠١٥ ژمارەی لێ دەرچوو.
پیرەمێرد تا ســـاڵی ١٩٣٢ بەناوی (حاجی تۆفیق بەگ) نووسین و شیعرەکانی بڵاو دەکـــردەوە، بەڵام لەو مێـــژووەوە ئیتر نازنـــاوی (پیرەمێرد)ی بۆ خۆی هەڵبژارد.
پیرەمێرد دوو ژنی هێناوە و ســـێ کچ و دوو کوری بوو. لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠ سەعات ٤ی دوای نیوەڕۆ پیرەمێرد لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و، بە پێی وەسیەتی خۆی لە گردی مامەیارەی سلێمانی بە خاک سپێردرا.



## گابریێل گارسیا مارکیز

دانا سەرباز – کەرکووک

ناوی تەواوی گابریێل خۆزێ گارســـیا مارکیزە و لە ٦ی ئاداری ســـاڵی ١٩٢٧ لەدایک بووە، ئێستا تەمەنی ٨٤ ســـاڵە، ئەم ڕۆماننووس و ڕۆژنامەوانە خەڵکی کۆلۆمبیایـــە و، دوو منداڵی هەن بەناوەکانی ڕۆدریک و گۆنزالیس.
مارکیز لە ساڵی ١٩٦٧ـەوە دەستی داوەتە نووسین.
گرینگترین کارە ئەدەبییەکانی مارکیز بریتییە لە ڕۆمانی (ســـەد ساڵ تەنیایی) کە زیاتر لە ١٠ ملیۆن دانەی لێ فرۆشـــرا و (خۆشەویســـتی لە ســـەردەمی کۆلێرادا) و (چیرۆکی مەرگێکی ئاشکرا) کە کراوەتە کارێکی شانۆیی و دەرهێنەری ناوداری کۆلۆمبیا خۆرخی تریانا کاری دەرهێنانی بۆ کردووە.
ئەم ڕۆماننووسە ساڵی ١٩٨٢ خەڵاتی نۆبڵی لە بواری ئەدەب وەرگرت هەروەها خەڵاتی فێردیزی بۆ شیعر وەرگرتووە.
مارکیـــز لە کتێبێکدا کە ســـاڵی ٢٠٠٢ بڵاوی کردەوە بە ناوی (ژیام تا بیگێڕمەوە) ژینامەی خۆی تا ســـاڵی ١٩٥٥ گێڕاوەتەوە.

# مەیموون و کیسەڵ



لەیلا میرزا غولام – کەرکووک



(زانا) شای مەیموونەکان بوو پێش ئەوەی مەیموونێکی گەنج دەری بکا. بۆیە چوو لە کەناری رووبارێک لەسەر دارێکی بەرز نیشتەجێ بوو. رۆژێک هەنجیرێکی لە دەست کەوتە ئاوەکەوە، دەنگەکەی پێ خۆش بوو و کەوتە فڕێدانی هەنجیر بۆ ناو ئاوەکە.





لەو کاتەدا کیسەڵێک لە ناو ئاوەکە بوو و هەنجیرەکانی دەخوارد. بەڵام کە کارەکە بەردەوام بوو، کیسەڵ وای زانی مەیموونەکە بۆ ئەو هەنجیر تێ دەگرێ بۆیە بڕیاری دا ببێتە هاورێی گیانی بەگیانیی.







کیسەڵ بە
مەیموونەوە خافڵ بوو و،
ژنەکەی وای زانی ڕاوچییەک کوشتوویەتی.
بەڵام کیسەڵێکی دراوسێیان پێی گوت:
«نا ئەو بووەتە برادەری مەیموونەکە
و ئەگەر هاتەوە خۆت نەخۆش بخە و،
پێی بڵێ دکتۆر گوتوویەتی دەبێ دڵی
مەیموونێک بخۆی بۆ ئەوەی چاک ببیتەوە».





ئەوەندەی
نەبرد کیسەڵ
گەڕایەوە،
تەماشای
کرد ژنەکەی زۆر کز و
ماتە.
بۆیە لێی پرسی: «چیتە ئازیزم؟»، بەڵام
هاوسێکەیان وەڵامی دایەوە: «ئەوە
نەخۆشە و دەبێ دڵی مەیموونێک بخوا بۆ
ئەوەی چاک ببێتەوە».



کیسەڵ سەری سوڕ ما و گوتی: «باشە دڵی
مەیموون لە کوێ بێنین؟».
ئیتر کەوتە بیرکردنەوە: «ئایا شیاوە
ناپاکی لەگەڵ مەیموونی هاوڕێم بکەم؟»،
هەر خۆی وەڵامی خۆی دایەوە: «نەخێر
مەحاڵە».





بەڵام زیاتر بیری کردەوە و گوتی:
«ئەی چۆن ڕێ بدەم ژنەکەم کە
هاوبەشی ژینمە بمرێ؟».
ژنەکە بانگی کرد:
«خۆشەویستەکەم بیر
لە چی دەکەیتەوە؟»،
وەڵامی دایەوە:
«هیچ هیچ».







ژنەکەی جێ هێشت
و بۆ لای مەیموونی
هاوڕێی چوو.
مەیموون لێی پرسی:
«لە کوێ بووی
هاوڕێکەم؟»، وتی:
«بیرم لەوە دەکردەوە
چۆن پاداشتت بدەمەوە
و دەمویست داوەتت
بکەم». مەیموون گوتی: «ئێمە هاوڕێین
و پێویست ناکا داوەتم بکەی بۆ ئەوەی چاکەم
بدەیتەوە».



کیسەڵ وەڵامی دایەوە: «بەڵام ئەگەر نانێ
بەیەکەوە بخۆین خۆشەویستیمان زیاتر دەبێ».
مەیموون قایل بوو. لە ڕێ مەیموون هەستی کرد
کیسەڵ خەمبارە و کە لێی پرسی زانیی ژنەکەی
نەخۆشە. بۆیە مەیموون پرسیی: «ئەی دەرمانی
چییە؟».



كيسەڵ گوتی: «شـــەرم دەكەم بيلێم، بەڵام پزيشك دڵی مەيموونی بۆ نووسيوە».
مەيموون زانيی كە كيســـەڵ نيـــازی ناپاكيی هەيە، بۆيـــە بيری لـــە فێڵێك كـــردەوە و، گوتی: «ئەی بۆ پێشتر پێمت نەگوت؟ مەگەر تۆ نازانی مەيموون كە سەفەر دەكا دڵی لە ماڵەوە جێ دێڵێ؟».
كيســـەڵ پرســـيی: «ئەی ئێســـتا كوا دڵت؟»، گوتی: «لەسەر دارەكەيە».





كيسەڵ گوتی: «با بگەڕێينەوە».
هەردووكيـــان گەڕانـــەوە و كـــە گەيشـــتنە كەنار ئاوەكـــە مەيموون بـــازی دا و چووە ســـەر دارەكە و دانەبـــەزی، كيســـەڵيش بانگی كرد: «دەی دڵت بێنە و وەرە».
مەيمـوونيـــش لـــە وەڵامـــدا گوتی: «ترحێـــو، تۆم هەڵخەڵەتـــان و ئێمە چيی تر هـــاوڕێ نيپـــن، چونكە تۆ ويستت ناپاكيم لەگەڵدا بكەی».





# زانيارييەكانت لەسەر ژينگە زياتر بكە

**شنە ئارام**

هـــەر كاتێك زيندەوەران، ئاژەڵ يان رووەك، بمرن و لە كاتی دەردانی پاشـــەڕۆيان، ئەو بـــڕە نايترۆجينەی لە مادەی ئۆرگانيی ئەو رووەك و ئاژەڵانەدا هەيە دووبارە دەگەڕێتەوە ناو خاك.
لە ناو خاكدا زيندەوەری فرە بچووك هەن پێيان دەگوترێ شيكەرەوەی ئۆرگانی، كە ئەو ماددانە شی دەكەنەوە و دەيكەنە خۆراك بۆ سيستمی ژينگەييمان لە شێوەی (ئامۆنيا) كە ڕووەك بۆ دروستكردنی پرۆتينی رووەكی بەكاری دێنێ. ئەو پرۆتينەش زۆر بەسوودە بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ.
ئـــەو رووەكانەی توانای ســـوودوەرگرتنيان لە ئامۆنيا هەيە، بەشـــێكن لە جيهانی رووەك، بەڵام زۆربەی ئـــەو ئامۆنيايەی رووەك هەڵيدەمژێ بەهۆی بەكتريايەكی تايبەتەوە دەكرێنە مادەی نايترات و گازی نايترۆجينەكە وەك دەرهاويشـــتەيەكی لاوەكی لەو كارە بەرهەم دێت و دەگەڕێتەوە ژينگە.

# بنێشت جاوین سوودی تەندروستیی هەیە

کوردە تۆفیق - دووبز

له زۆر شوێن جاوینی بنێشت به شتێکی خراپ و ناشیرین لەقەڵـەم دەدرێ، بـەڵام تۆژینـەوە زانستییە تازەکان ئاشـکرایان کردووە کە جاوینی جاجک سوودی بۆ دڵ و مێشـک و جەسـتە هەیە و توانای فێربوون زیاد دەکات و تووڕەیی و سەرئێشە کەم دەکاتەوە.

ئـەو تۆژینەوەیـەی کـۆواری (ژیانـی تەندروسـت) لە تەمووزی ٢٠٠٩ بڵاوی کردووەتەوە ئاشـکرای کردووە کە بنێشـت جاوین هاوکارە بـۆ کەمکردنەوەی تووڕەیی. هەروەهـا جووڵەی بەردەوامی شـەویلاگە و گوپەکان لە کاتی جاوینیدا هاوکارە بۆ کەمکردنەوەی سەرئێشە. جگە لەمەش لێدانی دڵ خێراتر دەکات، بەمەش ئۆکسجینی زیاتر بۆ مێشک دەچێ و پرۆسەی بیرکردنەوە و تێگەیشتن باشتر دەکات.






## باینجان

جووتیار عەلی
هەفتەغار

باینجـان ڕووەکێکی گیاییـە تەمەنی یەک وەرزە و لـە سـەرەتای وەرزی بەهاردا، لە خاکێکـی لمین دەروێنرێ و پێویسـتی بـە پەین هەیە لەگـەڵ ئاودانی زۆر، دوای ئـەوەی بەژنی نزیکـەی ٤٠ سـانتیمەتر بەرز دەبێ دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر و دووبـارە دەچێنرێتـەوە و دەبێ ماوەی نێوان دوو شتڵ یەک مەتر بێ.
دوای ئەوە هەفتەی سێ جاران ئاو دەدرێ.
باینجان سـەوزەیەکی وەرزییـە، ڕەنگی بەرەکـەی مۆرێکـی تـۆخ یـان ڕەشـە، جۆرێکیشی هەیە سپییە، شێوەی بەرەکەی هێلکەیی درێژکۆلەیە.

بـەری باینجـان مـادەی چـەوری و کاربۆهایدرات و ریشاڵ و شەکر و پرۆتینی تێدایە، توێکڵەکەشـی ڤیتامینی بی و سی و کالسیۆم و ئاسن و فسفۆری تێدایە. باینجان بەکوڵاوی و برژاوی و سوورەوەکراویش دەخورێ.




## شامپۆ چییە؟

ڕێژنـە یوسـف - تەپـەی مـەلا عەبدوڵڵا

شامپۆ وشەیەکی هیندییە، بەو شتە دەگوترێ کە لە نێـوان هەردوو دەسـتدا هەڵدەگلۆفرێ.
لـە بەراییدا لە تواندنەوەی جۆرەکانی سـابوون دروسـت دەکرا، پاشـان کیمیاگەران لـە تاقیگە و کارگە گەورەکاندا لە مادە پاککەرەوەکان شـامپۆیان بەرهەم هێنا.
زانایان بەم شـێوەیە پێناسـەی شـامپۆ دەکەن: ئەو پێکهاتە کیمیاییەیە کە لەو مادە پاککەرەوەیە دروست دەکرێـن کە کەف دەکات و قژ خاوێن و خاو دەکاتەوە و وای لێ دەکا ببریقێتەوە و بە ئاسانی شانە بکرێ.
شـامپۆ بۆ یەکەمین جار لە سـاڵی ١٨٨٧ لە ئینگلتەرە بەکارهێنـرا، ئـەو کات تەنیـا سەرتاشـەکان بـە تواندنەوەی سابوون لە ئاوی سۆدا دروستیان دەکرد.
لـە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە بە شـێوەیەکی بەرفراوانتر بەکارهێنراوە و ئێسـتا هەزاران کارگە لە وڵاتانی جیهانـدا دامەزراوە و جـۆر و ڕەنگ و بۆنی جۆرەوجۆری تێدا بەرهەم دەهێنرێ، هەندێکیشیان لە ڕووەکی سرووشتیدا دێنە بەرهەم.



## لاقم مێروولە دەکا

شلێر محیدین – قەڵادزێ

هەندێک جار بەتایبەتی لە کاتی دانیشتن لاقمان بۆ ماوەیەک دەخەینە ژێر خۆمان هەست بە سرییەک دەکەین و دواتر کە بۆی جووڵاین تووشی جۆرە حاڵەتێک دەبین دەڵێی دەرزی ئاژەن دەکرێن بۆیە ئەو کەسە دەڵێت لاقم مێروولە دەکات. لای هەمووان ئاشکرایە خوێن بەئازادی بەنێو دەمارەکانی جەستەماندا ڕێدەکات و دەبێتە ڕاماڵینی ئەو هەموو پاشەڕۆ ژەهراوییانەی لەنێو خانەکانی دەمارەکاندا کۆ دەبنەوە. بەڵام ئەگەر بەربەستێک بووە هۆی پەنگ خواردنەوەی خوێنەکە ئەوا ئەو پاشماوانە کۆدەبنەوە و خامەکانی دەمارەکان لەکاری خۆیان دەکەون کە گوێزرانەوەی نامەکانە لە لاقەوە بۆ مێشک. جا کاتێ لاقمان ڕادەکێشین جارێکی تر خوێن بە دەمارماندا تێدەپەڕێت و ئەو مێروولە کردنە ڕوودەدات.



## مێژووی ئاڵا

چیمەن نەسرەدین
کەلار

زۆر لە مێژەوە ئاڵا هەبووە و لە جەنگەکاندا بلیند کراوەتەوە، بەڵام وەکو ئەوەی هەموو وڵاتێک ئاڵایەکی هەبێت بیرۆکەیەکی نوێیە و یەکەمین ئاڵاش کە لە پەڕۆ دروست کرا لەلایەن ڕۆمانییەکانەوە بوو. بەڵام کاتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا ئالای تایبەت بەخۆی دروست کرد زۆربەی وڵاتانی جیهان چاویان لە ئەوان کرد، بەریتانیاش لە ١٨٠١/١٢/١ ئالای خۆی ڕاگەیاند، فەرەنساش دوای شۆڕش ئاڵایەکی سێ ڕەنگی بۆ نوێنەرایەتی فەرەنسای پێ بکات دروست کرد. بەڵام ئاڵایەک لە ڕەنگەکانی سەوز و سپی و سوور بۆ یەکەمین جار لە ١٨٠٥ لەلایەن ئیتالییەکانەوە بەرز کرایەوە، ئەم ئاڵایەی ئێستای کوردستانیش بۆ یەکەمین جار لە مەهاباد لە کۆماری کوردستان بەرز کرایەوە.



## نیشانەی هەڵە یان ڕاست لەم ڕستانەی خوارەوە بدە

سەربەست کاکەوڵا-سۆران

- قیر لە نەوت پێکدێت
- زوهرە گەورەترین هەسارەیە
- ئۆرۆگوای بچووکترین کۆماری ئەمەریکای باکوورە
- چیای جەنگەڵ لە باکووری کوردستانە
- گورچیلە لە ڕۆژێکدا ٣٦ جار خوێن پاڵفتە دەکات
- زەیت لە کونجی دەردەهێندرێت
- ئەدیسۆن دووربینی داهێنا
- کاری سەرەکیی سپڵ دروستکردنی خڕۆکە سپییەکانە

# کۆشکی سپی White House

ئاسۆ ئیسماعیل - پردێ



بینایەکی پڕ بایەخە و مەڵبەندی فەرمی و نیشتەجێی سەرۆکەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە لە واشنتۆنی پایتەختدا، ئەم کۆشکە لە چوار نهۆم پێکهاتووە، درێژیی ٥٢ مەتر و پانیی ٢٦ مەترە، لەلایەن سەرۆک جۆرج واشنتۆنەوە ساڵی ١٧٩٢ دەست بە دروستکردنی کراوە و ساڵی ١٨٠٠ تەواو بووە، یەکەم سەرۆک کۆماری ئەمەریکا کە تێیدا نیشتەجێ بووە و دەسەڵاتی تێدا گرتووەتە دەست، جۆن ئادامس بووە، هەروەها ئەم کۆشکە ئەو شوێنەیە کە سیاسەتی ویلایەتە ئەمەریکاییەکانی تێدا دیاری دەکرێت، بۆیەش بە کۆشکی سپی نێو دەبرێت چونکە ساڵی ١٨١٤ لەلایەن سەربازەکانی ئینگلیزەوە سووتێنراوە. دوای ئەوەی نۆژەن کرایەوە بە ڕەنگی سپی بۆیە کرا، ئیتر لەو کاتەوە بە کۆشکی سپی ناوی دەرکرد.

# ئەم خزمانە چی بەیەکدی دەڵێن

سارا محەمەد-سەنگەسەر

- باوکت بە ژنی مامت دەڵێ: براژنمە
- دایکی باوکت بە دایکت دەڵێ:
- باوکت بە دایکت دەڵێ:
- باوکت بە خاڵت دەڵێ:
- دایکت بە باپیرت دەڵێ
- دایکت بە خوشکی باوکت دەڵێ:
- دایکی دایکت بە باوکت دەڵێ:
- دایکی دایکت بە دایکت دەڵێ:
- خاڵت بە دایکی دایکت دەڵێ:
- باوکت بە خوشکی دایکت دەڵێ:



جوان سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو ئازابە بابەتێکی لە بارەوە بنووسە !
ئەگەر نووسیت ئەوە بۆمانی بنێرە ، تا گەر شیبا ، ئەوا ئێمەش لەگەڵ وێنەکەی خۆتدا بۆتی بڵاوبکەینەوە .



# پشیلە چۆن لە تاریکیدا دەبینێ؟

پەخشان حەمە رەشید
سەنگەسەر

پشیلە سەر بە خێزانی شێر و پڵنگە، چوار دانی زۆر تیژی لە پێشەوەی دەمیدا هەن بۆ قەپگرتن و برینی گۆشت. کۆمەڵێ چرنووکی چەماوەی پێوەیە چوون دەرزین. پێیەکانی تووکاوین، یەکێک لەو شتانەی یارمەتیی پشیلە دەدات راوچییەکی چاک بێت، چاوەکانیتی. چونکە چاوەکانی دەتوانن لە تاریکیی شەویشدا ببینن. بۆیە زۆربەی راوەکانی لە شەودا دەبێت، لە رۆژدا گلێنەی چاوەکانی زۆر بچووک دەبنەوە و لە شەودا دەکرێنەوە و رێگە دەدەن بچووکترین تیشک لێیانەوە بچێتە ژوورەوە. باگراوندی چاویشی بە مادەیەک لە شێوەی زیوی زاخاودار سواخ دراوە، کەمترین تیشک کە دەدات لە چاوی پێچەوانەی دەداتەوە لەبەر ئەوە ئەگەر لایتێکی دەستی بەشەو بگرینە پشیلە دەبینین وەکو چرا دەسووتێن.

## من چیم؟

بەرزی جەلال - ئاغجەلەر

بەهار و هاوین دێمە کوردستان، ملێکی درێژی ١١٠سانتیمەترم هەیە کێشم لەنێوان ٢,٥ بۆ ٤,٥ کیلۆدایە، بۆق و گیانلەبەری چکۆڵە و مار دەخۆم، دەنووکم سوور و درێژە و لەسەر دارتەل و شوێنە بڵندەکان هێلانە دەکەم و هێلکە دەکەم لە ماوەی ٣٢ رۆژ لە نیوەی بەهار تا سەرەتای هاوین هەڵیدێنم.
دەزانی من چیم؟

## بۆچی دەپژمین

دارا محێدین - کفری





پژمین زۆرجار ئەو تەنە نامۆیانە دروست دەکەن کە دەچنە نێو کەپوومانەوە، یا لە ئەنجامی سەرما یاخود حەساسیەش دەشێت ئەو وروژانە دروست بکات. ئەوەش بە وروژاندنی لایەکانی پەردەی چلمی لووت. پژمین هەوڵێکی جەستەیە بۆ دەرکردنی تەنە وروژێنەرەکان و رزگاربوون لێیان.
هەروەها هەندێک جار دەماری چاو بەهۆی تیشکی زۆر تیژەوە پژمین چێ دەکات. لە کاتی پژمیندا هەموو جەستە تووشی موچرکە دەبێ. چونکە ئەو هەوایە بەخێرایی ١٦٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێریکدا دەردەچێت هەربۆیە سەرجەمی جەستە سەرجەمی جەستە دەلەرزێتەوەو چاویش بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دادەخرێت و دوای پژمین لاشە دەبوژێتەوە.



## ئاسک

و: ڕێژین کەرکووکی_ ڕەحیماوا

ئاسک ئاژەڵێکی شیردەری سمدارە، بەرزییەکەی لە ٦٠ سانتیمەترەوە بۆ ٩٠ سانتیمەتر دەبێت. کێشیشی لە نێوان ١٨ بۆ ٢٥ کیلۆدایە. گیاندارێکی گورج و خێرایە، دەتوانێت تا بەرزایی دوو مەتر باز بدات. مێیەکانیان لە نێرەکانیان بچووکترن. نێر و مێیان شاخیان هەن، بەڵام هی مێیەکان بچووکترن. چاویان زۆر تیژە، هەستی بیستن و بۆن کردنیشیان بەهێزە. گیاندارێکی کۆمەڵایەتین و بەمێگەل دەژین.

ئاسـک ئاژەڵێکی ڕووەک خۆرە و گیا و گەڵا و لقـی دارەکان دەخوات، بەخێرایی ڕادەکات، و بـە یەکێـک لە ناسـکترین و جوانترینی ئەو ئاژەڵانـە دادەنرێت، کە لە دارستان و دەشت و دەر و باخچەکاندا دەژین.



## ورچ

نازەنین حوسێن-کەرکووک

ورچ ئاژەڵێکی شیردەرە، قەبارەی گەورەیە و کلکی زۆر کورتە، مێینەی ورچ یەک جار لە سـاڵێکدا، یەک بۆ چوار بێچوو دێنێ، زۆربەیـان لە باکور دەژین، بەتایبەت باکوری ئەمەریکا و ئاسـیا، ڕەنگی ورچ لەنێوان قاوەیی و ڕەشە، هەروەها جۆرێکی تری ورچ هەیە پێی دەڵێن (ورچی جەمسەر) ئەم جۆرە ورچە ڕەنگی سپییە، بەڵام پێستیان ڕەشە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ڕێژەیەکی زۆری گەرمی لە جەسـتەیدا بپارێزێ، قورسـایی ورچـی نێرینە لە نێوان (٣٥٠ – ٦٥٠) کیلۆگرام دەبێت.

## کەر

پشتیوان محەمەد - قشلاخ



شـوێنی ژیانی ئەم ئاژەڵە شـیردەرە دارسـتان و کێڵگە و گوندەکانە . خواردنی سـەرەکی گیا و گوڵـە. درێژیی ١,٩تا ٢,٤ مەترە. مـرۆڤ لە کۆنەوە کەری بۆ سـواربوون و بار هەڵگرتن و عارەبانە ڕاکێشـان بەکار هێناوە. میسـرییەکان بەر لە هەزاران سـاڵماڵییان کـردووە. چینیش لە هەموو وڵاتـەکان پتر کەر بەکار دەهێنێـت. کەری کێـوی بەزۆری لـە دارسـتانەکانی ئەفریقـادا زۆرن و بەبڕ پێکەوە دەژین. ماکەر بەسـاڵێک زگ دەکات و بۆ ماوەی شەش مانگیش شیر بەجاشکەکەی دەدات.




ماردین - سلێمانی

## ئـای پاد
## I PAD



تازەترین جۆری ئامێـری کۆمپیوتەرە کە کۆمپانیای( ئەپڵی ) ئەمریکایی لە بازاڕدا نمایشـــی کردووە ، تازەترین جۆری بە ناوی ( ئای پاد ٤ ) بەم زووانـــە ڕەوانەی بازارەکانی جیهان دەکرێـت ، ئای پاد کۆمپیوتەرەێکی ئێجگار پێشـــکەتووە و لە ڕێگای ( پەنجە لێخشان ) کاردەکات و چەندین بەرنامە و پارچەی پێشکەوتوو لە خۆدەگرێت وەکو بلوتوس و وایەرلێس

## پێشینان و کەشوهەوا

ئالا نەوزاد - ئازادی

ئەگەرچـی جوتیـاران و ڕێبوارانـی پێشـینانمان نەخوێنـدەوار بوونە و هیچیان لەبارەی سـەرەتاکانی کەشـوهەوا نەزانیوە، بـەلام بە ئەزموونـی خۆیان و پێشـینانیان وەرزی تۆکـردن و نەمام ناشـتن و زۆر شـتی تری گرینگیـان بـە وردی دیاری کـردووە و گۆڕانکارییەکانی کەشوهەواشیان خوێندووەتەوە.

بۆ نموونـە دەرکەوتنی پەلکەزێڕینـەی بەیانیان بە نیشـانەی تەواوبوونـی باران داناوە و گوتوویانە بە دڵنیاییەوە بڕۆنە سەر کار و کێڵگەکانی خۆتان.

بەلام دەرکەوتنی پەلکەزێڕینـەی ئێواران مانای باران و تێکچوونی کەشـوهەوا بووە لایـان و دەیانگوت لە ماڵەکانتان بسرەون و دەرمەچوون.

دەرکەوتنی خەرمانەی دەوری مانگ بە شـەوان مانای نێزیک بوونەوەی تێکچوونی کەشوهەوا و ساردبوونی هەوا بووە لایان.

سوورهەڵگەڕانی ئاسـۆ لە کاتی ڕۆژئاوابووندا مانای ئەوە بووە کە ڕۆژی داهاتوو خۆرەتاوێکی بە تین دەبێ.

ئێستاش هەموو ئەو پێشبینییانەی پێشینانمان بە بەڵگە سەلمێنراون و لە زانستی کەشوهەوادا ئەو دیاردانە بە هەند وەردەگیرێن.



## هەڵۆی ماسیگرە

ئانیا وەلی - چەمچەماڵ

درێژییەکـەی (٥٠) سـانتیمێترە، نێرە و مێیەی یـەک ڕەنگن، دوای هەڵـۆی پەنجە کورت تەنیا هەڵۆیەکە پشتی بۆرە و بەرزگی سپییە و خەتی سینگی ئاماڵ بۆرە، سـەری سپی و کاکۆڵدارە، خەتی چاوی ڕەشـە و بەرەو پاش ملی کشاوە، باڵی باریک و درێژە، ژێر باڵی سـپییە و خەتی ڕێ ڕێی قاوەییە. کلکی ڕێ ڕێیە، لەسەر ئاو بە ئارامی لەنگەر دەگرێ و بۆ گرتنی ماسـی لوور دەبێتە ناو ئاو و لاقی پێش هەموو جێیەکی دەگاتە ئاو، بۆ وچان لەسەر دار یان ڕەوەزی کەنار ئاو هەڵدەنیشێ، هەمیشە نزیک گۆڵ و چەمی گەورە یان دەریا دەژێ، لەسـەر دار، لەسـەر ڕەوەز و دورگـەی دوورەدەسـت و تەنانەت لەسـەر عەرزی خێزەلان هێلانە ساز دەکا.



# پێبکەنە تا جوانتر بیت

نیشتمان عەلی-دوکان

## هێلکە

نەسرین - ئازادی

منالێک مریشکێکی کڕیبوو، هەموو ڕۆژێک سێ جاران ئاوی گەرمی پێ دەدا، کە پرسیاریان لێکرد بۆچی ئاوی گەرمی دەدەیتێ لە وەلامدا گوتی: بۆ ئەوەی هێلکەی کولاوم بۆ بکات.

## خ

بە کابرایەک دەلێن سێ ناو بلێ بە (خ) دەست پێ بکات ئەویش لە وەلامدا دەلێت: (خەسرەو ، خۆم، خوا عافوی کات باوکم)

## قوتابی

لە پۆلێکدا مامۆستایەک دوو قوتابیی هاری دەبێت پێیان دەلێت: ئەگەر بێت و لەمەودوا هارەبانی بکەن، یەکێکتان فڕێ دەدەمە دیجلە و ئەویترتان بۆ فورات، یەکێک لە قوتابییە هارەکان هاوار دەکات، لە شەتولعەرەب یەکدەگرینەوە.

# بخەنە

هیوا شاکر - خورماتوو

## دانساز

پیاوێک دەچێتە لای دانسازێک بۆ ددان کێشان، دانسازەکە ددانەکەی بۆ دەکێشێت ئەویش دەست دەبا دە دیناریەکی دەداتێ. دانسازەکە وردەی پێ نابێت، سەیرێکی پیاوەکە دەکات و دەلێ چی دەلێیت ددانێکی ترت بۆ بکێشم؟

## منال

منالێکی شەش سالان لەگەل باوکیدا دەچن بۆ بازاڕ، نزیکی بازاڕ دەبنەوە. کوڕەکە بە باوکی دەلێت باوکە من کوڕی کێم؟ باوکەش لە وەلامدا دەلێت بێگومان کوڕی منی، بەلام بۆ؟
کوڕەکەش دەلێت: باوکە ئەی بۆچی هەموو جارێک دایکم پێم دەلێت کوڕی سەگ؟!.

ديمانه

# حەز بە وێنەکێشان دەکەم بە ماجیکی ڕەنگاوڕەنگ

دیمانە: شاگوڵ سابیر-کەرکووک



پرسیار: دەکرێ خوت بە هاوڕێیانی حاجیلە بناسێنیت؟

وەڵام: ناوم دینا بەکرە، تەمەنم ٩ ساڵانە و دانیشتووی گەڕەکی ئیسکانم.

پرسیار: پۆلی چەندی و لە چ قوتابخانەیەکدا دەخوێنی؟

وەڵام: پۆلی سێیەمم و لە قوتابخانەی چوارباخی سەرەتایی کچانم.

پرسیار: ئارەزووت چییە؟

وەڵام: حەز لە وێنەکێشان دەکەم بە ماجیکی ڕەنگاوڕەنگ، لە تابلۆکانیشمدا زیاتر ڕەنگی سوور و سەوز و پرتەقاڵی بەکاردێنم. دایک و خوشکەکەم هاوکاریم دەکەن لە وێنەکاندا و ڕێنماییم دەکەن.

پرسیار: جگە لە وانەکانی قوتابخانە لە کاتی پشوودا چی دەکەیت؟

وەڵام: لە پشووەکاندا هەر خەریکی وێنەکێشان دەبم، ئەگەریش لە وێنەکێشان ماندوو بووم، هاوکاریی دایکم دەکەم لە ڕازاندنەوەی خوان و شووشتنی قاپەکان، هەندێ جاریش یارمەتیی باوکم دەدەم تا جلەکانی لەبەر بکات، چونکە لە ڕووداوێکی ئوتومبێلدا باوکم دەستی شکاوە و پێویستی بە یارمەتییە.

# ئارەزووم لە وێنەکردن و فیلمی کارتۆنە

دیمانە : سوزان کەریم - کەرکووک



ناوت: کەنیر فراس جەمال

تەمەنت چەندە؟ حەوت ساڵانم

پۆلی چەندی؟ یەکی سەرەتاییم

لە چ قوتابخانەیەکی؟ چوارباخ

ئارەزووت لە چییە؟ وێنەکردن و سەیر کردنی فیلمی کارتۆن

سەیری کۆواری حاجیلە دەکەی؟ بەڵێ هەموو جارێک باوکم کۆمەڵێک کۆواری مناڵانم بۆ دێنێتەوە حاجیلەشی تێدایە.

# کارەساتەکانی هەسارەی زەوی

گزنگ -کەرکووک

هەزاران ساڵە هەسارەکەمان رووبەرووی ژمارەیەکی زۆری کارەساتی سرووشتی بووەتەوە، کە هەندێکیان لە گەردوونی دەرەوەن و هەندێکی تریان لە دەریا و وشکانی و نێوجەرگەی زەوی خۆیەتی.

کارەساتەکانی گەردوونی دەرەوە، بریتین لەو نەیزەکانەی لە خولگەی زەوی نزیک دەبنەوە و بە هۆی کێش کردنی زەوییەوە زۆر بە توندی بەر زەوی دەکەون، ئەوانەی لە دەریا و ئۆقیانووسەکانیشەوە دێن لافاو و زریانی دەریایین، کارەساتەکانی نێوجەرگەی زەویش گرکان و بوومە لەرزەکانن، کە هەر هەموویان زەرەر و زیانی گەورەیان لێ دەکەونەوە و دەبنە مایەی ماڵوێرانیی دانیشتووانی سەر رووی زەوی.

لە ساڵی ١٨١٥دا گەورەترین گرکان لە دورگەی تامبۆرای وڵاتی ئیندۆنیسیا تەقییەوە و هێندەی تەقینەوەی ١٠ هەزار بۆمبی هایدرۆجینی بەهێز بوو و بووە هۆی ئاوارە کردنی سەدان کەسی دورگەکە و ژەهراوی بوونیان.

لە ساڵی ١٩٠٥دا مەترسیدارترین بوومەلەرزە وڵاتی ئیکوادۆری هەژاند، کە توندییەکەی هێندەی تەقینەوەی ١٠٠ بۆمبی هایدرۆجینی دەبوو و مەرگی هەزاران کەسی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

گەردوونناسان ئەوەیان روون کردووەتەوە، کە پێش ٦٥ ملیۆن ساڵ مەترسیدارترین کارەسات بە سەر زەویدا هاتبێ، کەوتنەخوارەوەی هەسارۆکەیەکە و بووە مایەی قرکردنی ژمارەیەکی زۆری زیندەوەرانی سەر زەوی، کە گرینگترینیان دایناسۆرەکانن و بە هێزی ١٠٠ ملیۆن بۆمبی هایدرۆجینی بەر زەوی کەوتووە.

## رێوییە فێڵبازەکەی ژمارە ٨ی حاجیلە لە چوارقوڕنە دۆزرایەوە

بەڵێ ئەمجارەش بۆ رێوییە فێڵبازەکەی حاجیلە کە ویستبووی دەرباز بێت هاورێمان فریشتە محەمەد عەبدوڵڵا ، پۆلی شەشەمی قوتابخانەی چوارقورنەی بنەڕەتییە لە ناحیەی (چوارقورنە) دۆزییەوە و حاجیلەی لێ ئاگەدار کردەوە، ئێمە وێڕای دەستخۆشی و پیرۆزبایی، ژمارەکانی ساڵێکی گۆوارەکەی بۆ دەنێرین لەگەڵ رێز و خۆشەویستیمان

بەهرە جەبار - سلێمانی

# مستەر بین



ڕوان ئەتکینسۆن ، هونەرمەندێکی بەهرەمەندی کۆمیدیای جیهانیە کە بە نازناوی ( مستەر بین ) ناسراوە .

مستەر بین ، یەکەمین نواندنی لە ساڵی ١٩٩٠ بوو ، کاتێک زنجیرەیەکی ١٤ ئەڵقەیی لە تەلەڤزیۆنی وڵاتی بەریتانیا ، لەو ساڵ پێشکەش کرا ، ناوبانگێکی زۆری بۆخۆی پەیداکرد و لە ساڵانی دواتر چەندین فلیمی درێژی پێشکەش کرد کە بووە مایەی دەستخۆشی بەشێکی زۆر لە بینەر و ڕەخنەگران لە سەرتاسەری جیهاندا .

مستەر بین ، لە کاری نواندنیدا پەنا دەباتە بەر جوڵە ، ڕووداوی بەپەلە ، خۆی دوور دەگرێت لە قسەکردن و دایەلۆگ کە بێگومان ئەم جۆرە هونەرە یەکێکە لە قورسترین کاری هونەری و نواندن .





## پەپوولە بچکۆلەکە و هاوڕێ لاسارەکەی

و: ئەنجام بابان - کەرکووک



پەپوولە بچکۆلە، پەپوولەیەکی زیرەک و ڕەنگاوڕەنگی جوان بوو، هەمیشە ئامۆژگارییەکانی دایکی لە یاد نەدەکرد.

ڕۆژێکیان بە قسەی هاوڕێکەی لە کێڵگەکەی خۆیان دوورکەوتەوە بۆ کێڵگەیەکی تر، کاتێک ئامۆژگارییەکانی دایکی بەبیر هاتەوە چپاندییە گوێی هاوڕێکەی و وتی: دەبێ بگەڕێمەوە دایکم پێی وتووین لە کێڵگەکەی خۆمان دوور نەکەوینەوە.

هاوڕێکەی دایە قاقای پێکەنین و وتی: هەی ترسنۆک من دەزانم تۆ ترسنۆکی.. وەرە هەی ترسنۆک وەرە.. وەرە... با گوڵێکی بۆن خۆشت پێشاندەم.

هەوڵی دا بەدەم بانگەوازی هاوڕێکەیەوە نەچێت، بەڵام لەبەر ئەوەی پێی نەڵێت ترسنۆک، کەوتە هاوشانی تا گەیشتنە گوڵێک کە بۆنە خۆشەکەی و ڕەنگی جوان و ڕازاوەکەی پەڕەکانی سەرنجیانی ڕاکێشا، هەردوو پەپوولەکە لە خۆشییاندا بۆی دەرچوون تا بگەنە ناو جەرگەی خونچەکە.

پەپوولە چکۆلەکە ئامۆژگاریی دایکی لەبیر چوو کە پێی وتبوو لە ماڵ دوور نەکەویتەوە و لە هیچ شتێکیش نزیک مەبەوە تا ڕەگ و ڕیشەی نەزانیت، تامی شیلەی گوڵەکە هەموو شتێکی لەبیربردەوە نەیدەزانی گەڵاکان وا دەورەیان داون و بەنیازن بیانخنکێنن کاتێک پەپوولە چکۆلەکە و هاوڕێکەی هەستیان کرد لە مردن نزیک بوونەتەوە، هەردووکیان چۆکیان دادا. تا لەولاوە گەڵایەکی بچووک لەناو جەرگەی گوڵەکەوە هات و هەردووکیانی لە مەترسی دوورخستەوە پەپوولە چکۆلەکە ئاوڕی لێ دایەوە تەماشای کرد ئەوە دایکێتی بزەیەکی بۆ کرد و گوێی لێ بوو دایکی وتی: دراوسێکەمان پێی وتم کە ئێوە بەرەو زیندەوەرخۆرەکان چوون، بۆیە بەدواتانا هاتم.

پەپوولە بچکۆلەکە بە شەرمەزارییەوە ڕووی کردە دایکی و وتی: دایە گیان لێم ببوورە ئەمە دواجارە.. دواجار..

سەرچاوە: لە ئینتەرنێتەوە

## حەوت جاران بێ وەستان ئەم ڕستەیە بڵێرەوە

زانا سەباح-کەرکووک



سێ قەرتاڵە هات بە تاوا
یەکیان موو بوو ، یەکیان توو بوو ، یەکیان گوو بوو
چنگم دا لە موو ، قەپم دا لە توو ، لەقەم دا لە گوو

# ڕێوی و قەلەڕەشکە و گورگ

و: دلێر زەنگنە - کەرکووک



قەلەڕەشکەیەک لەسەر دارێک نیشتەوە، ڕێوییەکی برسی چاوی پێ کەوت و بەدەنگێکی بەرز بانگی کرد: سڵاو ئەی قەلەڕەشکەی هاوڕێم وەرە با پێکەوە بدوێین و گوێم لە دەنگە خۆشەکەت بێت.
قەلەڕەشکە وەڵامی دایەوە: چۆن بۆ لای تۆ دابەزم دەتەوێ زەفەرم پێ بەری.
ڕێوی وەڵامی دایـــەوە: ئەی هاوڕێم ئێمە پەیمانێکمان لەگەڵ یەکتر مۆر نەکـــردووە، کە چیتر دژایەتیی یەکتر نەکەیـــن و بە ئاشـــتی بژین پێکەوە، هەموومان هاوکاری یەکتر بین و بەهێـــزەکان یارمەتیی لاوازەکان بدەن، ئەوسا خێر و بەرەکەت دەڕژێتە سەر هەمووان.
قەلەڕەشکە بیری کردەوە و بەخێرایی وەڵامی ڕێویی دایەوە و گوتی: ئەوە گورگێک لە پشتەوە هات و هەموومان پێکەوە دادەنیشین و گوێ لەیەک دەگرین و خۆشترین و تازەترین گۆرانیتان بۆ دەچڕم.
هەرئەوەندەی کە ڕێوییەکە گوێی لێ بوو گورگەکە هات، بەدەنگێکی بڵند هاواری کرد: جارێکی تر دێمەوە لات نەوەک ئەو گورگە زەفەرم پێ بەرێ.
قەلەڕەشکەکە پێی گوت براکەم بۆ دەترسیت، ئەی ئێمە پەیمانێکی هاوبەشمان مۆر نەکرد؟ (ببوورە پەیمانێکی هاوبەشیمان مۆر کرد بۆ ئاشتی)
سەرچاوە: ئینتەرنێت

# پشیلە و کەڵەشێر و مشکیلە

نووسینی: تۆڵستۆی
و: شلێر محەمەد - کەرکووک



ڕۆژێک بەچکە مشکێک بۆ پیاسەکردن چووە گۆڕەپانەکەی نزیک خۆیان، هەینێ گەڕایەوە بەدایکی گوت:
- دایە گیان، دوو گیانلەبەری سەیروســەمەرەم بینی، یەکیان سامناک و تۆقێنەر، ئەوی تریشیان تابڵێی ناسک و نەرم ونیان بوو.
دایکی گوتی: ئادەی گوڵی دایە زیاتریانم بۆ وەسف بکە.
مشکیلە وەڵامی داوە: دایە تۆقم چوو، کە بینیم دوو قاچی ڕەش، پۆپنەیەکی سوور بەتەوقی سەریەوەیە، دوو چاوی خڕ و گەورە، لووتیشـــی قولاپ ئاســا چەمابووەوە، کاتێک نزیکی بوومەوە دەنووکی واز کرد و قاچی بەرز کردەوە و بەدەنگی بەرز قووقاندی، زەندەقم چوو.
دایکی گوتی: ئەوە کەڵەبابە گوڵی دایە، کەس ئازار نادا و لێشی مەترسە.
- بەڵام ئەوی تریان لەبەر ڕۆژەکە پاڵی لێ دابووەوە، گەردنی ســپی ورنجەی دەهات، پێیەکانی خۆڵەمێشـــی بوون، زگی خۆی دەلستەوە، ئەودەمی بینیمی کەوتە کلکە لەقێ.
دایکە گوتی: ئای کە نەفامیت مشکیلە نازدارەکەم، ئەوە دوژمنە هەمیشەییەکەمانە، پێی دەڵێن: پشیلە.

# ١٠ ئەفریقیای ناوەڕاست



ڕۆشنا کەرکووکی
کەرکووک

**ناوی وڵات:** کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست

**پێگەی جوگرافیایی:** ئەفریقیای ناوەڕاست دەکەوێتە ناوەڕاستی کیشوەری ئەفریقیا، لە باکورەوە چاد و لە ڕۆژهەڵاتەوە سوودان دەوریان داوە، زائیر و کۆماری کۆنگۆ دەکەونە باشووری و کامیرۆن سنووری ڕۆژاوئاوای پێکدێنێ.

**ڕووبەر:** ٦٢٢ هەزار و ٩٨٤ کیلۆمەتری دووجا.

**ژمارەی دانیشتووان:** ٣ ملیۆن و ٨٠٠ هەزار کەس.

**چڕیی دانیشتووان:** ٦ کەس لە کیلۆمەترێکی دووجادا.

**پێکهاتەی ئاینی:** ٥٠٪ کریستیانی پرۆتستانت، ٣٣،١٪ کریستیانی کاتۆلیک، ٣،٢٪ موسڵمان، ٠،٣٪ بەهائی، ١٢٪ ئاینی هۆزەکی، و ١،٤٪ ئاینەکانی تر.

یانگی (٥٥٣ هەزار کەسی تێدا دەژێ).

**گرینگترین شارەکانی:** بمباری، بربراتی، بۆروار.

**جۆری حوکمڕانی:** پەرلەمانیی فرە حزبی.

**دراو:** فرەنکی ئەفریقیایی.

**زمان:** فرەنسی و سانجۆیی.

**گرینگترین هەناردەکانی:** قاوە، چا، تەختە، پەموو، ئەڵماس، عاج.

**گرینگترین هاوردەکانی:** خۆراک، کەرەستەی هاتوچۆ، دەرمان.

**کات:** گرینتچ + ١.

**مێژووی بە ئەندام بوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان:** ١٩٦٠

**ڕیزبەندییەکان:** شەشەمی جیهانە لە بەرهەمهێنانی ئەڵماسدا.












# تیپی ڕیال مەدرید

وەرزین حەمە  قادرکەرەم

ناوی تەواوی ئەم تیپە (تیپی شاهانەی مەدرید بۆ تۆپی پێ)ـیە، بە تیپی (سپی) ناسراوە و ناوە کورتکراوەکەی (ڕیال مەدرید)ـە. لە ٦ی ئاداری ١٩٠٢ بە ناوی یانەی مەدرید بۆ تۆپی پێ دامەزرا.

یاریگەی ئەم تیپە بریتییە لە یاریگەی (سانتیاگۆ بێرنابیۆ) لە شاری مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا. کە ٨٠ هەزار و ٣٥٤ کەس دەگرێ. ناوی سەرۆکی تیپەکە (فلۆرەنتینۆ پیریز)ـە و ئەم تیپە لە خولی ئیسپانیا یاری دەکا و وەک باشترین تیپی تۆپی پێ لە سەدەی بیستەمدا هەڵبژێردراوە.

ڕیال مەدرید ٣١ جار خولی ئیسپانیای بردووەتەوە و ١٧ جار جامی شای ئیسپانیای بردووەتەوە. هەروەها ٩ جار پاڵەوانێتیی خولی پاڵەوانانی ئەوروپاشی بەدەست هێناوە.

# تۆپی پێی ئەمەریکایی

حوسین قارەمان  کەرکووک



تۆپی پێی ئەمەریکایی وەرزشێکە لە ئەمەریکا بە (football) ناسراوە.
مەبەست لەم یارییە تێپەڕینە بەناو یاریزانانی تیپەکەی بەرامبەر تا گەیشتن بە ئەوسەری ناوچەی ڕکابەر.

لە تۆپی پێی ئەمەریکاییدا تۆپ بە دەستەوە دەگیرێ و دەکرێ فڕێ بدەی بۆ یاریزانێکی تر بۆ ئەوەی بەرەو پێشەوە بیبا. هەروەها یاریزان دەتوانێ تۆپەکە بداتە دەستی یاریزانێکی تر.

گۆڵکردن لە تۆپی پێی ئەمەریکاییدا بە چەند شێوەیەکە:
بەرەو پێشەوە چوون و تێپەڕاندنی هێڵی گۆڵی تیپی ڕکابەر بەبێ وەستان، یان هاویشتنی تۆپەکە بۆ یاریزانێکی تر کە لەودیوی هێڵی گۆڵەکەیە، یان شووتکردنی بەرزی تۆپەکە بۆ ئەوەی بە نێوان ئەو دوو ستوونەدا بڕوا کە لە کۆتاییی ناوچەی تیپی ڕکابەردان.

تیپی براوە لە تۆپی پێی ئەمەریکاییدا ئەو تیپەیە کە لە ماوەی دیاریکراودا زۆرترین خاڵ تۆمار دەکا.

ژمارەی یاریزانانی هەر تیپێک زیاترە لە ٥٠ یاریزان، بەڵام تەنیا ١١ یاریزان لە یەک کاتدا لە ناو یاریگەدا دەبن.

# هاوڕێیانمان ئارەزووی چی دەکەن و چی دەخوێننەوە؟

ڕیپۆرتاج : نەواز ئەحمەد



شیڤان شێرزاد تەمەنی ١٢ ساڵانە و لە پۆلی شەشەمی قوتابخانەی سەرەتایی باسەڕەی تێکەڵە. لەشولارێکی ڕێکوپێکی وەرزشییانەی هەیە، لێمان پرسی ئارەزووت چییە؟ گوتی: وەرزش، بەتایبەتی یاریی تۆپی پێ، بێجگە لە کتێب و وانەکانی خۆم، ئارەزووی خوێندنەوەشم هەیە و زۆربەی گۆوار و ڕۆژنامە وەرزشییەکان دەخوێنمەوە. ئەو باسی ڕەوشی خۆیانی بۆ کردین کە چۆن تا پێش دوو مانگ لەبەر نەبوونی پۆل، لە بن خێوەتدا دەیانخوێند و باران کتێب و دەفتەرەکانیانی تەڕ دەکردن، بەڵام باش بوو ڕێکخراوێکی خێرخواز هات و ٣ پۆلی بۆ دروست کردن، سوپاسیانی دەکرد.



ئیسرا محەمەدی تەمەن ٩ ساڵان هاوڕێیەکی ترمانە و لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییە لە قوتابخانەی چوارباخی سەرەتایی کچان، یەکێکە لە حوێنەرانی گۆواری حاجیلە و ئارەزووی نووسینی سروود و هۆنراوەیە بۆ منداڵان، دەیگوت: زۆر جار هەوڵم داوە بە شیعر و چیرۆک بەشداری لە گۆوارەتان بکەم. زۆر حەزیشم لە چێشتی یاپراخە و ئەو ڕۆژانەی دایکم لێیدەنێ، هاوکاریی دەکەم. گشت مامۆستاکانم بەبێ جیاوازی خۆش دەوێن و ئەوانیش زۆر میهرەبانن لەگەڵمان و بێجگە لە فێرکردن، هانمان دەدەن لە چالاکییە هونەری و وەرزشییەکانیشدا بەشدار بین.



ئاسۆس کازم، جلێکی کوردیی مۆری لەبەرکردبوو و بە نمایشێکی شانۆیی بەشداریی لــە چالاکییەکــی قوتابخانەکەیان کرد، ئەو تەمەنی ١٢ ســاڵانە و لە پۆلی شەشــەمی ســەرەتاییە و بێجگە لە خوێندنــی وانەکانی خۆی ئــارەزووی خوێندنەوەی کۆوارە تایبەتەکانیشــە کە بۆ منداڵان دەردەکرێن، لە نمایشێکی شــانۆییدا ڕۆڵی هاوسەرێکی خراپی دەگێڕا و پاش تەواوبوونی شانۆگەرییەکە، پێمانی گوت: من لە تاقیکردنەوەکانی نیوەی ساڵدا دووەم دەرچووم و بەو هیوایە دەخوێنم کە ببم بە پزیشک، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرم حەز لە شــانۆگەرییە و حەزیش دەکەم ناوبەنــاو لە قوتابخانەکەماندا ئەم جۆرە چالاکییانە ســاز بدرێن تا بەشدارییان تێدا بکەم، لەو کاتانەشدا کە دەستم بەتاڵ دەبێ، کۆواری ( کەپر ) دەخوێنمەوە.



نەوال ڕەشــید، لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییە و تەمەنی ١٣ ساڵانە، بە جلێکی کوردیی جوانەوە خۆی ڕازاندبووە و بەشداریی ئاهەنگێکی قوتابخانەکەیانی کردبوو، دەیگوت: زۆر حەز لە خوێندنەوەی شیعری کوردی دەکەم و جاربەجاریش چیرۆک دەخوێنمەوە. بۆ دوواڕۆژیش ئەم هاوڕێیەمان حەز دەکا ببێ بە مامۆستای زمانی کوردی و قوتابییان فێری زمان و ئەدەبی کوردی بکات، چونکە ئەو پێیوایە مامۆستا پیشەیەکی زۆر پیرۆزە و ســاڵانە نەوە دوای نەوە پێدەگەیەنێ و ئاســۆی ژیانیان بۆ ڕۆشــن دەکاتەوە، بۆیە دەیگــوت : دەبێ ئێمەی قوتابی چەند ڕێز لە دایــک و باوکی خۆمان دەنێین، ەوەندەش ڕێز لە مامۆستاکانمان بنێین و خۆشمان بوێن.



ئەڤین نەوزاد، بەبەخشینەوەی شــیرینی پێشوازیی لە میوانانی قوتابخانەکەیان دەکرد و بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنی دەکردن. ئەم هاوڕێیەمان حەزی لە خوێندنەوەی کــۆوارە کوردییەکانە و بــە بەردەوامی کــۆواری حاجیلــە دەخوێنێتــەوە. ئاهەنگی قوتابخانەی پیرەمێردی سەرەتایی بە بۆنەی کردنەوەی کتێبخانەیەک بوو، کە لەلایەن خێرخوازێکەوە کرابووە، بۆیە ئەڤین بەو منداڵییەی خۆیەوە هەستی دەکرد ئەم کارەی خێرخوازان هەڵوێســتێکی دڵســۆزانەیە و ســوود بە قوتابییان دەبەخشــێ و گوتی : ئارەزووشم وێنەکێشانە بە قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ.

# ئازاردانی گیانلەبەران

ساری کەمال تەمەن ١٣ ساڵ - چەمەچەماڵ

ڕێبوار کوڕێکی لاســاره، زۆر ئازاری گیانلەبــەران دەدات، لە کۆڵانی ماڵی ڕێبوار دارێکی گەورەی لێ بوو، لەسەر ئەم دارە چۆلەکەیەکی جوان لەگەڵ چەند بێچوویەکی خنجیلانەدا هێلانەیان لەسەر کردبوو. ڕۆژێکیان ڕێبوار لە کۆڵان دانیشتبوو سەیری درەختەکەی دەکرد، بینی هێلانەی چۆلەکەیەکی، کەوتە بەرد تێگرتنی دارەکە بۆ ئەوەی هێلانەکە بەربێتەوە و ئازاری چۆلەکەکان بدات، بێچووە چۆلەکەکانیش کەوتنە جریوە جریو لە ترســا، دایکە چۆلەکەیش هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو نەیدەزانی چی بکات، ناچار بوو لە هێلانەکە خۆی دەرباز کرد و لەسەر لقی دارەکە نیشتەوە و بە ڕێبواری وت: ئەوە چی دەکەیت کــوره بچکۆلەکــە چ کارت بەم درەختە هەیە خۆ ئــەم درەختە هیچ بەرێکی پێــوە نییە بۆچی بەردی تێدەگریت؟ ڕێبوار وتی: دەزانــم بەری پێوە نییە، بەڵام دەمەوێت هێلانەکەتان بەربدەمەوە. چۆلەکەکە وتی: بۆچی بەری دەدەیتەوە خۆ هیچ ســوودێک بەتۆ ناگەیەنێت و هیــچ ڕێگایەکمان لەتۆ نەگرتووە تکات لێ دەکەم هێلانەکەمان لێ تێک مەدە و با بێچووەکانم نەمرن، ئەگەر بەری بدەیتەوە بێچووەکانم دەمرن و تۆش گوناحت دەگات و هیچیشــت دەست ناکەوێ. باشە ئەگەر یەکێک ماڵ لە ئێوە تێک بدات تۆ چی دەکەیت؟ ڕێبوار هیچی نەوت هەر وەستابوو، چۆلەکەکە وتی: بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟ ڕێبوار کاتێــک بیری کردەوە زانی کارەکەی هەڵەیە بڕیاری دا هێلانەکەیان لێ تێک نەدات و جارێکی تر کاری وا دووبارە نەکاتەوە و هەرگیز ئازاری گیانلەبەران نەدات.



# کەڵەشێر و ڕێویی فێڵباز

چۆپی ئیسماعیل

پۆلی: یەکەم قوتابخانەی فێنک - کەرکووک

ڕۆژێک لە ڕۆژان کەڵەشێرێک لەسەر درەختێک وەستابوو، ڕێویی فێڵباز چاوی پێکەوت و بانگی کرد و گوتی: کەڵەشــێر... کەڵەشێر بڕیار وایە هەرچی ئاژەڵ هەیە لەم دارستانەدا ببنە هاورێ و چیتر ڕێوی پەلاماری مەر و مالآت نەدات و پشــیلە پەلاماری جووجە و مریشک نەدات و پڵینگیش پەلاماری ئاسک و سەگیش پەلاماری پشیلە نەدات.

ڕێوی بەم قسانە فێڵی لە کەڵەشێرەکە کرد و باوەری پێ هێنا و هاتە خوارەوە لەسەر درەختەکە.

ڕێویی فێڵباز خۆی بۆ هەڵدا و کەڵەشێرەکە بەخێرایی هەڵفری خۆی کردەوە سەر درەختەکە و گوتی: ئیتر من باوەر بەتۆ ناکەم.

بۆیە گووتویانە بە زورنای هەموو کەس هەڵمەپەرە.

# خوێندەواری گرینگە

محەمەد رزگار
پۆلی چوارەم
قوتابخانەی ژیاری بنەڕەتی



دوو کوری لاو هاوڕێی یەکتر دەبن یەکێکیان ناوی ئازادە و ئەوی تریان نەوزاد ، لە قوتابخانــە دەیانخوێند ڕۆژێکیان باوکی نەوزاد بە نەوزادی گوت: کوڕم واز بێنە لــە خوێندن لەبەر ئەوەی من دوکانێکت بۆ دەکرم، نەوزادیش ڕازی بوو بەڵام ئازاد لەسەر خوێندن بەردەوام بوو.
نەوزادیش چووە سەر دوکانەکە و دەستی بەکار کرد بەڵام ئیشیان زۆر خراپ بوو، ماڵی ئازادیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو باشی دەچوون، ماڵی نەوزادیش دوکانەکەیان لەدەســت دا و نەوزاد زۆر پەشـیمان بووەوە دووبــارە گەڕایەوە بۆ قوتابخانەکەی و دەســتی کرد بە خوێندن لەگەڵ ئازادی هاوڕێی.



# پۆلی یەک

ئیسماعیل عوسمان-کەرکووک

ئێستاکە شەش ساڵانم
من دەرچووی باخچەکانم
ئەمساڵ دەڕۆم بۆ خوێندن
بەرەو لوتکەی سەرکەوتن
دارا و دارا دەخوێنم
کتێبم نادڕێنم
لەناو پۆل بە ژیرانە
دادەنیشم بۆ وانە
چی بڵێ مامۆستاکەم
بەگوێی دەکەم وا ئەکەم
ئەگەر ئەرکم بۆ نووسین
دەبێ وەرگرم ئافەرین
ئەگەر ساڵیش تەواو بوو
پۆلی یەک دەبڕم بۆ دوو
تاکو لوتکەی سەرکەوتن
کۆشش کەم بێ سرەوتن

# شێرێکی مەرد

هیوا و دارا-کەرکووک



لە دارستانێکدا شـێرێک پاشا بوو، ئەم شێرە زۆر بەجەرگ و بەوەفا بوو، نەیدەهێشــت ئاژەڵەکانی ئەو دارستانە بەدەســت ئاژەڵانی دیکەوە ئازار بچێژن،
ئەم پاشایە بێچوویەکی زۆر دڕندەی هەبوو بۆیە نەیدەهێشت لە ماڵەوە بچێتە دەرەوە، بەڵام هەر ڕۆژێک باوکی لەگەڵ شـێرەکانی دیکەدا بڕۆیشتایەتە دەرەوە ئەمیش بە دزیی پاشــاوە دەڕۆیشتە دەرەوە و، بێچووی ئاژەڵانی دیکەی دەخوارد.
پاشا ئەمەی بیستەوە ویستی بیکوژێ، ڕۆژێک لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ سەر ڕووبارێک و پێی گوت: ئەگەر توانیت مەلەوانی بکەیت ئەوا من تۆ دەکەم بە پاشا و لە جێی خۆمت دادەنێم، بێچووەکەش ڕازی بوو و خۆی فڕێدایە ناو ئاوی ڕووبارەکە لە ناکاودا تیمســاحێکی گەورە خۆی بۆ فڕێدا و خواردی.
پاشــا زۆر خەمبار بوو لەبەر ئەوەی بێچووەکــەی مرد، بەڵام ئاژەڵەکانی دارســتانەکە بە پێچەوانــەوە زۆریان پێ خۆش بوو. دوای چەند ســاڵێک پاشــا بێچوویەکی دیکەی بوو بەڵام ئەم بێچووەی فێر کرد ئاژەڵانی دیکە نەخوات بۆیە پێش ئەوەی بمرێت بێچووەکەی کرد بە پاشای ئەو دارستانە و خۆی مرد.
ئەویش وەکو باوکی کەســی ئازار نەدا تەنیــا ئەو ئاژەڵانەی ئازار دەدا کە ئازاری ئاژەڵەکانی دیکەیان دەدا.

# زیانەکانی هەڵمژینی دووکەڵی جگەرە

ناز ئەحمەد-رەحیماوە



جگەرە کیشـــان یەکیکە لەو کارە خراپانەی کە مروڤ خووی پیوە دەگری و راســـتەوخو کاریگەریی نەرینیی لەســـەر تەندروســـتیی مروڤ هەیە و دەرکەوتووە کە مروڤی جگەرەکیش زیاتر تووشـــی نەخوشییەکانی گوی دەبـــی، هەروەهـــا ئەوانەی جگەرە ناکیشـــن و تەنیـــا دووکەلی جگەرەی کەســـیکی تر هەلدەمژن ئەگەری کەربوونیان زیاترە لە کەسانی دوور لە دووکەل.

لیکولینەوەکانیش دەریانخســـتووە، ئەو دووکەلـــەی لە تووتنی جگەرەوە دەردەچیت دەبیتە هوی ریگەگرتن لە گەیشـــتنی خوین بو خوینبەرەکانی گوی و گوی بییەش دەکەن لە ریژەی پیویستی ئوکسجین.

پسپورانیش دەلین: نازانین ریژەی ئەو دووکەلە هەلمژراوە چەندە کە دەبیتە هوی کەربوون، بەلام باشترین ریگە بو خوپاراستن، دوورکەوتنەوەیە لەو شوینانەی دووکەلی جگەرەی تیدا قەتیس ماوە.

بویـــە ئیوەی مندالانیش دەتوانن بە زمانیکی شـــیرین و بە ریزەوە داوا لە باوک و دایکە جگەرەکیشەکانتان بکەن کە ئەگەر جگەرەش دەکیشن با لە شوینیکی داخراودا نەیکیشـــن و دووکەلەکەی نەکەنە سینگە خاوینەکەی ئیوەوە.

# چەند ڕێنوێنییەک سەبارەت نانخواردن

چاوان عەلی-زیویە

مروڤی ئاســـایی لە روژانی ئاساییدا، روژانە ٣ جار نان دەخوات، و بەو جارانە دەگوتریت (ژەم). کە گرینگترینیان ژەمی بەیانیانە و پزیشکان جەختی لەسەر دەکەنەوە. مروڤیش وزە و هیز و توانای لە خوراکەوە دەست دەکەویت.

بویە بو پاراستنی تەندروستیمان پیویستە ئەم رینوینییانە رەچاو بکەین:

یەکـــەم: دەبی روژگارمـــان بە ژەمە خواردنی بەیانیان دەســـت پی بکەین و بەبی نانخـــواردن نەچینە قوتابخانە، ئەگەریش هەر حەزت لە خواردن نەبوو، بەلانی کەم پەرداخیک شیر بخورەوە.

دووەم: ژەمە خواردنەکانت لە کاتی دیاریکراوی خویاندا بخو و هیچیان لە دەست خوت مەدە.

ســـییەم: با ژەمـــە خواردنەکانت لەگەل تیکرای ئەندامانی خیزانەکەتدا بیت و جـــوت جودا مەکەرەوە و هەرگیز لە بەردەم تەلەفزیوندا نان مەخو.

چوارەم: پاروووەکانت بە جوانی بجاوە و هەول بدە لە کاتی نانخواردندا قسە نەکەیت.



# پشووی حاجیلە

کوردستان محەمەد - ئازادی



## هە لێبێنە

- بە هەموو زمانێک دەدوێ
- بە سێ برا لاقێکیان هەیە
- بشمریت لێت نابێتەوە
- خڕە وەک هەرمێ سپییە وەک بەفر
- دێو نییە و ددانی هەیە

## ئایا دەزانی

- نۆتەی موزیک لە پێنج خاڵ پێک هاتووە.
- ماوەی سکپڕیی ماین ١١ مانگە.
- درێژیی گەدەی مرۆڤی ئاسایی ٢٥ سانتیمەترە.
- ناوی کۆنی عەممان فیلادلفیا بوو.
- ماوەی سکپڕیی پشیلە ٦٣ ڕۆژە.



## بەم وشەگەلە ئەم پەندانەی خوارەوە تەواو بکە

**سێبەر، عیلم، میوان، مزگەوت، چاکە**

- تا ماڵ وەستابێت.......حەرامە
- ......... لە چاکە دەبێتەوە
- حازرخۆری بەر..........
- حیلم لە ........ چاترە
- ......... دیاریی خوایە



## پەندی بەرینان

شاتوو خەسرەو - سەرچنار

## وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە

ژمارەی خانەکانی مرۆڤ چەندن؟

- ٦٠ ملیۆن
- ٧٠ ملیۆن
- ٨٠ ملیۆن

لەکاتی پێکەنیندا چەند ماسوولکە دەجولێت؟

- ١٧ ماسوولکە
- ٢٧ ماسوولکە
- ٣٧ ماسوولکە

ئێسکەکانی باڵ چەندن؟

- ٣١ ئێسک
- ٤١ ئێسک
- ٥١ ئێسک

لووتی فیل چەند ئێسکی تێدایە؟

- نییەتی
- یەکی تێدایە
- چل ئێسکی تێدایە

دڵی مشک لە خولەکێکدا چەند جار لێدەدات؟

- ٣٠٠ جار
- ٤٠٠ جار
- ٥٠٠ جار

## بمرەنگێنە

لەرین - سلێمانی





## ڕامان

سنجانە سالار - گوندی قشلاخ

**لەم کۆمەڵە فۆرمانەدا، پێویستە چ ژمارەیەک لەو شوێنەدا دابنرێت؟**



## ئەمە چییە؟

**حەمەسیروان یاسین-دارەتوو**

ڕەشە و خاڵی سپی پێوەیە، درێژیی ٢١ سانتیمەتر و کێشی ٧٤-٩٠ کیلۆگرامە، ٥-٧ هێلکەی سپی مەیلە و شینی کاڵ دەکات ١٢-١٣ ڕۆژ لەسەری کڕدەکەوێ، لە بەهار و سەرەتای هاوین هەڵیدەهێنێ، بەکۆمەڵ دەژین و ڕەو دەکەن. زیندەوەری چکۆلە و میوەو تۆ و توو دەخۆن، زیکە زیک دەکەن.

## قۆناخ بە قۆناخ وێنە بکێشە




**نەجات عەبدوڵڵا - کەرکووک**

## چاوتیژی

**شیلان بەکر - ڕەحیماوە**



جوان لەم درەختە وردبەرەوە و بزانە چەند کەللەسەری پێوەیە .

**نیگار نامیق - شوان**



ئەمانە مرۆن یان سێبەری درەختەکان

## کۆدی وڵاتان

خاوەر کاکەبرا   بازیان



ئەمەریکا: ٠٠١

بەلجیکا: ٠٠٣٢

پاکستان: ٠٠٩٢

تایلەند: ٠٠٦٦

چین: ٠٠٨٦

یابان: ٠٠٨١

سوید: ٠٠٤٦

کەنەدا: ٠٠١

ڤیتنام: ٠٠٨٤

ئیسپانیا: ٠٠٣٢

ئوستralیا: ٠٠٦١

## کتێب

لاوە زەنگنە - پەنجا عەلی

ناوی یەک کتێبی ئەم شاعیرانە لە بەرانبەر ناوەکانیان بنووسە :

- لەتیف هەڵمەت
- شێرکۆ بێکەس
- عەبدوڵڵا پەشێو
- جەمال غەمبار
- ئەحمەدی مەلا
- عەباس عەسکەر

ئەگەر زانیت ئەوا دوو کتێبی ئەم شاعیرانەت پێشکەش دەکەین.

## هاوشێوە

تەنیا وێنەیەک هاوشێوەی وێنەی سەرووەیە

شەیدا شەماڵ - کەرکووک



## هونەری دەست

نەجات عەبدوڵلا - ڕەحیماوە



## بمگەیەنە

نەجات عەبدوڵلا - کەرکووک



## وەڵامی ژمارەی پێشوو

ل٣ مەتەڵ: درۆ

ل١٣ من چیم : حاجی لەقلەق

ل٣٠ ڕامان : ٢٨

ل٣٤ گەیاندن : ١٩٢٢/١١/١٨

شـقاتە، تەڵێک لـە حەوتەکە هەڵدەگری دەیخەیتە سـەر کەمەکە

ل٣٦ شیکاری : زۆزک

وشەی بزر :قەندیل

بیرکاری ١٣٣ ملیۆن و ٧٠٠ هەزار

خەڵات :دۆلفین

ل٣٨ ماتماتیک : ٩ ڕۆژ


خاوەنی ئیمتیاز

بەدران ئەحمەد حەبیب

سەرپەرشتیار

عوف عبدالرحمن

سەرنووسیار

حەمە سەعید زەنگنە

٠٧٧٠١٣١٠٥٤٢

hamatal_ z@yahoo.com

جێگری سەرنووسیار

ئەبەز ڕۆستەم

بەڕێوەبەری هونەری و نەخشەسازی

پەروەر

تایپ

دلێر ڕەفیق

ناونیشان

کەرکووک - شەقامی کۆماری

تەلاری صیدلی فخری

# گەیاندن

ئـەم هێڵانە بگەیەنـە ، لات پەنی دەبێت لـە چ مێژوویەکدا ئێزگەی کوردی لە بەغدا کرایەوە

هونەر عاسی - داقووق




تەنها ٥ جیاوازی لە نێو ئەم دوو وێنەیەدا هەیە . . . . . دەتوانیت دەستنیشانیان بکەیت ؟



پروشە جەبار - سلێمانی

## یاریی شقارتە

ڕۆژ دلێر - ئازادی




جێگۆڕکێ بە یەک تەڵە شقارتە بکە تا ئەنجامی هاوکێشەکە بکاتە بیست و شەش .

# جێگۆڕکێ

جێگۆڕکێ بە دوو ژمارە بکە تا بە ستوونی و ئاسۆیی کۆی ڕیزەکان بکاتە ٢١

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 5 | 2 | 2 | 6 | 1 | 3 |
| 6 | 1 | 3 | 4 | 2 | 5 |
| 4 | 3 | 1 | 2 | 5 | 6 |
| 2 | 6 | 5 | 1 | 3 | 4 |
| 1 | 5 | 6 | 3 | 4 | 2 |
| 3 | 4 | 4 | 5 | 6 | 1 |

هێشو جوامێر - سەنگەسەر

# هاوبەشی

دلێر - چەمچەماڵ





لە نێوان ئەم دوو وێنەیەدا

پێنج شتی هاوبەش هەیە

# سێبەر

سێبەر مام کەروێشک ونبووە ،

دەتوانیت بیدۆزیتەوە ؟





پۆلا سامی - کەرکووک

# شاخە بڵندەکانی جیهان

محەمەد نەوزاد-تەکیە

چیای ئەڤەرێست ٨٨٤٨ مەتر بەرزە لە هەرێمی تبت-نیپال

چیای گودۆین ئەستن ٨٦١٠ مەتر بەرزە لە هەرێمی تبت

چیای کانشانگیونگا ٨٥٨٥ مەتر بەرزە لە هەرێمی سیکیم- نیپ

چیای نانکاباربات ٨١٢٥ مەتر بەرزە لە وڵاتی هیند

چیای ستالین ٧٥٠٠مەتر بەرزە لە وڵاتی رووسیا

چیای مزناک ئانا ٧٤٢٩ مەتر بەرزە لە چین

چیای ئەکونکاگوا ٧٠٢٣مەتر بەرزە لە ئەرجەنتین

چیای ئەنکوهاما ٦٩١٩ مەتر بەرزە لە پۆلیڤیا

# وشەی بزر

داستان محەمەد -ئازادی

دوای ئـەوەی بە هێڵێکی ڕاسـت ئەم نێوانـەی لای خـوارەوە دەسـڕیتەوە، ناوێکت بۆ دەمێنێتەوە لە حەوت پیتان پێکهاتـووە و ناوی شـارێکە کیمیاباران کرا سەر بە پارێزگای سلێمانییە.

هۆنـراوە، هێلیان، هاوسـەنگ، هەڤبەند، هانا، هاونیاز، هاودەنـگ، هەرسـین، هەستیار، هاودەم، هەڵوان.

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ه | ە | ڤ | ب | ە | م | د | ە | ە |
| ب | ه | گ | ه | ر | ه | ا | ن | ا |
| گ | ا | ن | ە | ا | ج | م | ه | ۆ |
| ن | و | ە | ر | ی | ه | ە | ە | ن |
| ە | ن | د | س | ت | ا | د | ڵ | ا |
| س | ی | و | ی | س | ن | و | و | ی |
| و | ا | ا | ن | ە | ا | ا | ا | ل |
| ا | ز | ه | ه | ه | ە | ه | ن | ێ |
| ه | ه | ۆ | ن | ر | ا | و | ە | ه |

# کوێرکردنەوە

جوان خورشید – سەید سادق

دوای ئەوەی بە هێڵێک پیتەکانی نێوی ئەم میوانە کوێر دەکەیتەوە (پرتەقـاڵ، هەرمـێ، هەنجیـر، هەنار، قۆخ، تو) ناوی میوەیەکت بۆ دەمێنێتەوە پزیشکان ئامۆژگاریمان دەکەن هەمـوو بەیانییـەک دانەیەکی لێ بخۆین.

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ە | ر | ر | ت | ن | ه | و | ج | س | ێ |
| ە | پ | ر | ت | ه | ق | ا | ڵ | م | ێ |
| ە | خ | ر | ن | ق | ه | ا | و | ۆ | ی |

# شیکاری

ڤارین کاروان- کەرکووک

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 1 | + | 3 | = | |
| 5 | + | 2 | = | |
| 6 | - | 3 | = | |
| 10 | - | 6 | = | |
| 8 | + | 7 | = | |
| 4 | - | 1 | = | |

نـاوی یەکێـک لـە هاوینەهەوارەکانی کوردستانە، تـۆش پاش شـیکارکردنی ئەم پرسـیارە بیرکارییـە بزانـە چ هاوینە هەوارێکە.

| | | |
|---|---|---|
| ر | = | 3 |
| ە | = | 7 |
| س | = | 4 |
| ی | = | 15 |



## خەڵات

١- زێڕی سپی لۆکەیە.

٢- زێڕی ڕەش نەوتە.

٣- ئەدی زێڕی سوور چییە؟

دوا دەلیقە ٢٥/ ٤

## گوتەی نێوداران



زۆرزان کەم و، نەزان فرە دەدوێ — جان جاک ڕۆسۆ

لاوازترین مرۆڤ ئەوانەن، کە ناتوانن نرخی خۆیان ڕاگرن — دانیال

مەزنترین خۆشەویستی، ئەڤینیی دایکە — لینکۆڵن

ناوبانگی باش کراسێکە لە هیچ دەمێکدا کۆن نابێ — ئەدیسۆن

کارکردن هاوڕێ دروست دەکات — گۆتە

شیرین عەلی - ڕانیە

## سودوکو

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | 2 | | | | 5 |
| | 5 | 4 | | | |
| | | | 6 | 4 | |
| | 6 | 1 | | | |
| | | | 3 | 2 | |
| 2 | | | | 1 | |

هیوا عەلی - چەمچەماڵ

تۆڕی سودۆکو پێکهاتووە لە ٣٦ چوارگۆشەی بچووک و ٦ لاکێشەی گەورە. ئەوەی پێویستە لێرە لەسەر تۆ چوارگۆشەکان بەژمارە (١-٦) پڕبکەیتەوە بەمەرجێک هیچ ژمارەیەک لە ڕیزی ئاسۆیی و ستوونیی لاکێشەکاندا دووبارە نەبێتەوە.

## وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە

١- لەکوێ بەڕێوەبەر دەکەوێتە پێش سەرکۆمار؟

٢- ئەو شتە چییە لەسەر ئاسمانە و لەژێر دەریایە؟

٣- مامۆستایەک بە قوتابییەکی گوت پێچەوانەی (نان)م دەوێت، مەبەستی چییە؟

٤- ئەو دەریایە لە کوێیە ئاوی تێدا نییە؟

٥- شتێک هەیە لە کاتی بارانبارینda دەکرێتەوە، چییە؟

«فەرهەنگ، خاڵ، نان، نەخشە، چەتر»

ڕێناز عوسمان - سەنگەسەر

تاقیگەی حاجیلە

## بیرکاری

چرۆ عبدالرزاق - هەولێر

ئەگەر ٣٣٪ی قوتابیانی قوتابخانەیەک حەزیان لە وەرزش بێت، و ١٥٪یان ئارەزوویان هونەری شانۆ بێ، ١٨٪شیان دەنگیان خۆشـــە و حەز لە گۆرانی گوتن بکەن،و ئەوانی دەمێننەوە ئارەزوویان سەیران و گەشت و گوزارە، ئایا ڕێژەی سەدیی ئەم کۆمەڵە چەندە؟

## ماتماتیک

خەسرەو محەمەد - کەرکووک

ژنێک بۆ بازاڕی کردن دەچێتە بازاڕی ئەحمەد ئاغا، کە تەماشـــای جانتای پارەکەی دەکات ٧٧٥٠ دینـــاری پێیە ٣ کیلۆ تەماتە دەکڕێت، هەر دوو کیلۆی بە ٧٥٠ دینار و کیلـــۆ و نیوێک باینجان دەکڕێت هەر کیلۆی بـــە ٦٥٠ دینار و ٥٠٠٠ دینار دەدات بە خـــاوەن دوکانەکە، ئەویش جگە لە پارەی ئەمانـــە کە پارەکەی دەداتەوە پێی دەڵێت ئەوە ٣٧٥ دیناری دوێنێشم بڕی کە لات مابووەوە.

ئایا کە هاتەوە بۆ ماڵ و لەنێو پاس پارەی ســـێ هـــاوڕێ هەر یەکە ٢٥٠ دیناری دا چەند لە چانتاکەیدا مابووەوە.

## تاقیکردنەوەی(٢)

ناز کەریم-تەکیە

هەنگاوی یەکەم: پڕ کەوچکێک شیر بخەرە ناو شووشەیەکی پڕ ئاوەوە و جوان تێکیدە.

هەنگاوی دووەم: شووشەکە بەرە ژوورێکی تاریکەوە و بە تیشکی لایتێکی دەستی، شووشەکە ڕووناک بکەرەوە، دەبینی ڕەنگی شیرەکە شین هەڵگەڕاوە.

هەنگاوی سێیەم: لایتەکە بخەرە ئەودیوی شووشە شیرەکەوە و خۆت وەرە ئەودیو، تەماشای شووشەکە بکە، ئەمجارەیان دەبینی ڕەنگی شیرەکە، سوور هەڵگەڕاوە.

هۆکاری ئەم جیاوازییە چییە؟

شـــیرەکە وەکو گەردەکانی هەوا هەڵســـوکەوت دەکات، کە ڕەنگە جیاوازەکان پەرش و بڵاو دەکاتەوە، کاتێک لە دیوی خۆتەوە تەماشای شووشەکە دەکەیت، ڕەنگی شین لە هەموو ڕەنگەکانی تر زیاتر پەرش دەبێت و شووشـــەکە بە ڕەنگی شین خۆی دەنوێنێ، بەڵام کاتێک لەودیوەوە تەماشای شووشە شیرەکە دەکەیت، ڕەنگی سوور لە هەموو ڕەنگەکانی تر زیاتر پەرش دەبێت. بۆیە لە کاتی ڕۆژئاوابووندا ئاسمان مەیلەو سوور هەڵدەگەڕێت.

